به دیاری دەبەخشرێت و نافرۆشرێت

# دایە و بابە

## چۆن فێری دینەکەم دەکەن؟

سەرەتایەکە بۆ فێربوونی ئاینی ئیسلام

ئامادەکردنی: سلیم أحمد کریم








پێناسی کتێب:
ناوی کتێب: دایە و بابە چۆن فێری دینەکەم دەکەن؟
ئامادەکردنی: سەلیم ئەحمەد کەریم
دیزاین: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نۆرەی چاپ: یەکەم١٤٣٣- ٢٠١٢ - هەولێر
شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر ٤٦٣٩٥٣١
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٧١) ی سالی ٢٠١٢ی پێ دراوە.



# سوپاسنامە

دەست خۆشی لەو هەمو برا بەڕێزانە دەکەم کە ئەرکی لە چاپ کردنیان گرتە ئەستۆی خۆیان وەدەست خۆشی لەو برایانەدەکەم کە بە هەر شێوەیەک یارمەتی دەرم بوون بۆ ئەم کارە خوای گەورە پاداشتی بە خێریان بداتەوە.

براتان:سلیم أحمد كريم

بسم الله الرحمن الرحيم

# سەرەتایەک بۆ فێربونی قورئانی پیرۆز

سورەتی فاتیحە یەکێکە لەو سورەتە هەرە مەزنانەی کەوا ڕۆژانــە پێویستە لەسەر ئێمە لەهەموو نوێژەکان بیخوێنین هەربۆیە لەم ڕۆژگارەی وەکو ئەمڕۆ سەیر دەکەین گەلێک لە مسوڵمانان لەم سورەتە بە شێوەیەکی بەرچاو هەڵەی تیا ئەکەن هەربۆیە ئێمەش ئەم سورەتە بەردەستی ئێوەی ئیماندار ئەکەین تاوەکو پێداچونەوەیەک بەم سورەتەدابکەین و خۆمان لە هەڵە لەم سورەتە مەزنە بپارێزین.





بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١)

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣)
مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥)
اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ
عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (٧)

## آية الكرسى

أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيم

اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ
لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي
يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ
وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ
كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ
الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ (٢٥٥)البقرة

## تەفسیری ( آیة الکرسی )

خوا زاتێکە جگە لە ئەو هیچ خوایەکی ترنیە کە شایەنی پەرستن بێت و ئەو هەمیشە زیندووە و ڕاگرو سەرپەرشتیکاری (هەموو دروست کراوەکانیەتی)، نە وەنەوز دەیگرێت و نە خەو (چونکە ڕاگرو سەرپەرشتیاری بوونەوەرە)، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر ئەوزاتە خاوەنیانە، کێیە ئەوەی (دەتوانێت) تکا بکات لە لای ئەو، بەبێ مۆڵەتی خۆی، دەشزانێت چی لە ئێستاو داهاتوو و ڕابووردودا ڕوویداوەو ڕوودەدات، هیچ کام لە دروستکراوانی زانست و زانیاری تەواویان نیە دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فێریان بکات (ئەم پێشکەوتن و زانستەی سەردەم بەشێکی کەمن لە بەخششەکانی خوا)، فەرمان ڕەوایی و دەسەڵات و زانینی ئەوزاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە و پارێزگاریان بەلای خواوە هیچ گران نیە و ماندووی ناکات و هەر ئەو خوایەکی بەرزو بڵند و گەورەیە.



## سورة الإخلاص

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ
(٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)

## سورة الفلق

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ (١) مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ (٢) وَمِن
شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (٣) وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ
(٤) وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (٥)

## سورة الناس

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ (١) مَلِكِ النَّاسِ (٢) إِلَهِ النَّاسِ
(٣) مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ (٤) الَّذِي يُوَسْوِسُ
فِي صُدُورِ النَّاسِ (٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ(٦)





## پیتەکانی زمانی عەرەبی

پیتەکانی زمانی عەرەبی لە کۆی ئەم پیتانە پێک هاتووە[٢٨]پیتن بریتین لە:

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| أ | ب | ت | ث | ج | ح | خ | د |
| ألف | باء | تاء | ثاء | جيم | حاء | خاء | دال |
| ذ | ر | ز | س | ش | ص | ض | |
| ذال | راء | زاء | سين | شين | صاد | ضاد | |
| ط | ظ | ع | غ | ف | ق | ك | |
| طاء | ظاء | عين | غين | فاء | قاف | كاف | |
| ل | م | ن | هـ | و | ي | | |
| لام | ميم | نون | هاء | واو | ياء | | |

بەهیوای ئەوەی بەباشی ڕاهێنان بکەین لە سەر ئەم پیتانە.

**ئەو پیتە عەرەبیانەی کەلە زمانی کوردی دانین**

کۆمەلێک پیت هەن لەزمانی عەرەبی کەلە زمانی کوردی دانین:

بریتین لە

[ث – ذ – ص – ض – ط – ظ ].

[ثاء– ذال – صاد – ضاد – طاء– ظاء].



## بيروباوەڕى ئيسلامى

پ/پلەكانى ئاينى ئيسلام چەندن؟
و/سێن: ئيسلام – ئيمان – ئيحسان

پ/١/ئيسلام چيەو ئەڕكانەكانى چەندن؟




و/ئيسلام واتا ملكەچ بوون و جێ بەجێ كردنى گشت فەرمانەكانى خودا ئەڕكانەكانيشى پێنجن:

يەكەم: شايەدى هێنان: أشهد أن لآإله إلآالله وأشهد أنّ محمداً رسول الله
دووەم: وإقام الصلاة: نوێژ كردن.
سێيەم: وإيتاء الزكاة: زەكات دان.
چوارەم: وحج البيت: حەجى ماڵى خودا.
پێنجەم: وصوم رمضان: بەڕۆژيبونى مانگى ڕەمەزان.




پ / ٢/ ئيمان چيەو ئەڕكەكانى چەندە؟

و/ئيمان واتا باوەڕ هێنان بەدڵ وبە زوبان وەئەنجام دانى كردەوەى چاك وەئەڕكەكانى شەشن:

يەكەم: الإيمان بالله: باوەڕبوون بەخودا.

دووەم: الإيمان بالملائكة: باوەڕبوون بە مەلائيكەتان.

سێيەم:الإيمان بالكتب السماوية: باوەڕبوون بەو كتابانەى لاى خودا هاتوون.

چوارەم: الإيمان بالأنبياء والرّسل: باوەڕبوون بەو پێغەمبەرانەى لاى خودا هاتوون.

پێنجەم: الإيمان باليوم الآخر: باوەڕبوون بە ڕۆژى دوايى.

شەشەم:الإيمان بالقدر خيره وشرّه: باوەڕبوون بە پێشهاتە جا چ خێر بێ يان شەڕ بێ.

پ/٣/ئايا ئيحسان چيە؟

و/پە رستنى خودايە وەک ئەوەى دەيبينى ئە گەر تۆ نەيبينى ئەو تۆدەبينێ.

پ/واتاى ((لاإله إلاّ الله)) چيە؟

و/واتا باوەڕبوون بەوەى هيچ پەرستراوێک بەحەق نيە جگە لە الله.

## چۆنیەتی بانگدان

الله أكبر ، الله أكبر
الله أكبر ، الله أكبر
أشهد ألاّ إله إلا الله
أشهد ألاّ إله إلا الله
أشهد أنّ محمداً رسول الله
أشهد أنّ محمداً رسول الله
حي على الصلاة، حي على الصلاة
حي على الفلاح، حي على الفلاح
الله أكبر ، الله أكبر
لا إله إلا الله





# چۆنیەتی قامە ت کردن

الله أكبر ، الله أكبر

أشهد ألا إله إلا الله

أشهد أن محمداً رسول الله

حي على الصلاة

حي على الفلاح

قد قامت الصلاة , قد قامت الصلاة

الله أكبر ، الله أكبر

لا إله إلا الله

*تێبینی:- وا سوننەتە کاتێ بانگبێژ لە بانگ دان بویەوە.

اللهم رب هذا الدعوة التامة والصلات القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً محمداً الذيَ وعدته . ((رواه البخاري)).

پێغەمبەری خودا دەفەرموێت هەرکەسێک لە پاش هەموو بانگێک ئەم دووعایە بخوێنێت شەفاعەتی منی لە قیامەت بۆ حەلال دەبێت.



# چۆنیەتی دەست نوێژ گرتن



دروست نیە دەست نوێژ مەگەر بە ئاوێکی پاک کەرەوە، ئەویش بریتیە لەو ئاوەی کە وەک خۆی مابێتەوە و نەگۆڕابێت، هەروەها دروست نیە دەست نوێژ گرتن بە ئاوێک بۆن و تام و رەنگی گۆڕابێت بەهۆی شتێکی پاکەوە، وەک ئاوێک کە گۆڕابێت بەهۆی ماستاو شەربەت.



١- سەرەتا نیەت دێنی دەستپێکردنی دەست نوێژ بە (بسم الله) دەبێت، سونەتە هەردوو دەستی سێ جار بشوات پێش هەموو دەستنوێژێک.



٢- پاشان سوننەتە سێ جار ئاو لە دەمی وەربدات.



٣- پاشان سوننەتە سێ جار ئاو لە لووتی وەربدات.

٤- پاشان دەم و چاو شۆرین، یەک جار پێویستە (واجب)ە، وە سێ جاریش سوننەتە.



٥- پاشان یەک جار هەردوو دەستی تادەگاتە ئانیشکەکانی بشوات یەک جار پێویستە (واجبە)وە، سێ جار سوننەتە.

تێبینی: پێشخستنی دەستی راست بەسەر دەستی چەپدا سوننەتە.



٦- پاشان هەندێک سەری بە ئاو مەسح بکات، پێویستە ((واجبە)) هەمووسەریشی سوننەتە مەسح بکا پاشان پەنجەکانی شایەتمان بخاتە کونە گوێکانی و بە پەنجە گەورەکانی دەرەوەی گوێکانی مەسح بکات، ئەمەش هەمووی یەک جار بێت .



٧- پاشان پێویستە (واجب)ە یەک جار قاچەکانی لەگەڵ، سێ جار سوننەتە.

تێبینی: ئەمەش بە(ترتیب)یەک لە دوای یەک واجبە.

٨-دوای دەست نوێژسوننتە بڵێ:

أشهدأن لا اله لا الله وحده لا شريك له وأشهدأن محمداً عبده ورسوله اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين.

# چۆنیەتی نوێژ کردن



پێویستە نیەتی نوێژەکە بهێنی ئینجا کاتێک ڕاوەستا بۆ نوێژ بە «الله اکبر» نوێژەکەی دەست پێ دەکات، دەستەکانی بەشێوەیەک کە پەنجەکانی بەیەکەوە بلکێنێ بەرزیان بکاتەوە تا ئاستی شانەکانی لەکاتی «الله اکبر»ی نوێژدا بەستندا.







بەدەستی ڕاستی مەچەکی دەستی چەپی دەگرێت و لەژێر سنگی دا دەنێت، چاوی دەبرێتە شوێن سوجدەکەی، پاشان (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) دەڵێت و پاشان (بسم الله الرحمن الرحیم) دەڵێت، هەموو، پاشان سورەتی (الفاتحة) دەخوێنێت.

پاشان چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز دەخوێنێت کە لە (٣) ئایەت کەمتر نەبێت.

تێبینی: ئیمام بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنێ لە بەیانیان و دوو رکاتی ئەوەڵی مەغریب و عیشا و بێجگە لەمانە بەدەنگی نزم دەخوێنێت.



پاشان «الله اکبر» دەکات و دەست بەرز دەکاتەوە و دەچێتە رکوع، پاشان سێ جار دەڵێت: (سبحان ربی العظیم)

**تێبینی** : ئەگەر بگات بەم ڕوکنەدا (واتە بە رکوع) لەگەڵ ئیمام واتا نوێژەکە بە جەماعەت بوو ئەوە گەیشتووە بە رکاتێک با فاتیحە نەخوێنێ.

پاشان سەری بەرز دەکاتەوە دەڵێ (سمع الله لمن حمده) وە هەردوو دەستەکانی لە گەڵیدا بەرز بکاتەوە و ڕێک دەبێتەوە و دەڵێ (ربنا ولك الحمد ، حمد كثيرا طيباً مباركا فيه ملك السماوات و ملك الأرض ماشئت من شيء بعد).



پاشان سوجدە دەبات و «الله اکبر» دەکات و سێ جار دەڵێ ((سبحان ربي الأعلى)).





پاشان سەری بەرزبکاتەوە و«الله اکبر» بکات ودابنیشێ، هەروەکو ئەم وێنانە دووجار جار بڵێت ( ربي أغفر لي ) .





ئەگەر لە ڕکاتی دووەم تەواو بوو دائەنیشێ بۆ تەحیات، وتەحیات ئەخوێنێ:

(التّحيّاتُ لله والصلواةُ والطيبات, السلامُ عليكَ أيُّها النَّبيُّ ورحمة الله وبَركاتهُ السّلامُ علينا وعلى عباد اللهَ الصالحين, أشهدُ أن لا إله إلا الله, وأشهدُ أن محمداً عبدهُ ورسولهُ).



لەنوێژی سێ ركاتی وچوار ڕکاتی هەڵدەستێتەوە و «الله اکبر» دەکات ودەستی بەرز دەکاتەوە، باقی نوێژەکەی وەک لە ڕابردوو باسمان کرد تەواو دکات، بەڵام بە پەنهانی دەیخیوێنێ و تەنها فاتیحەش دەخوێنێ .




پـاشـان بـۆ تەحیاتی کۆتـایی دابنیشێ لەسەر سمتی، هەروەکو ئەم وینەیە.

پاشان دەست دەکات بە خوێندنی تەحیات وەک تەحیاتی یەکەم، بەڵام لەتەحیاتی دووەمدا ئەمەی بۆ زیاد دەکات :

(اللهُمَّ صَلِّ على محمد وعلى آل محمد كما صلَّيتَ على إبراهيم وعلى آلِ إبراهيم إنَّك حميدٌ مجيد) .

* سوننەتە لەدواي تەحیاتدا ئەم دوعایە بخوێنێت

( أعوذ بالله من عذابِ النار، وعذابِ القبر، وفتنةِ المحيا والمماتِ، وفتنة المَسيح الدجال ).



پـاشـان دوو سـەلام دەداتـەوە، بـەلای ڕاستدا ئـاوڕ دەداتـەوە ودە ڵێت (السَّلامُ عليكم ورحمةُ الله) !هەروەها بەلای چەپەشدا دەیڵێتەوە.

# هەندێك لەو شتانەی
# كە نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە

١- قسەكردن لە كاتی نوێژ دا .
٢- زۆر جـــولانەوە .
٣- كەسێک دەستنوێژی بشكێت .
٤- پشت كردن لـــــە قیبلە .
٥- شـــــت خواردن .
٦- پێكەنینی بە دەنگ .

## ژمارەی ڕكاتی نوێژەكان وسوننەتەكان

| ناوی نوێژەكان | ژمـــــــارەی ركانەكانی واجب | سـونـەتـەكـانـی پیش نویژ | سو نە تە كا نی پاش نوێژ |
|---|---|---|---|
| بەیانی | ٢ | ٢ | نیە |
| نیوەڕۆ | ٤ | ٢-٢ | ٢ |
| عەسر | ٤ | ٢-٢ | نیە |
| مەغریب | ٣ | ٢ | ٢ |
| عیشا | ٤ | ٢ | ٣ |

## زیکرەکانی دوای نوێژ

لە پاش ئەوەی نوێژەکەمان ئەنجام دا دەست دەکەین بەم زیکرانە سێ جار بڵێ:

((استغفر الله)) ((استغفر الله)) ((استغفر الله))

پاشان بلێ :

((اللهم انت السلام منك السلام تباركت ياذاالجلال والإكرام لا حول ولاقوت إلاَبالله اللهم لامانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت ولاينفح ذاالجد منك الجد)).

## پاشـــان:

| | | |
|---|---|---|
| ٣٣ | جاربڵێ | سبحان الله |
| ٣٣ | جاربڵێ | الحمد لله |
| ٣٣ | جاربڵێ | الله أكبر |

لە پاشان بڵێ :- ((لاآله إلاَ الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمدُ وهو على كل شيءٍ قدير)).



پاشان: ((آية الكرسي دەخوێنین)).

پاشان:

* جارێک :- قل هو الله أحد .... دەخوێنین
* جارێک :- قل أعوذ برب الفلق .... دەخوێنین
* جارێک :- قل أعوذ برب الناس .... دەخوێنین

** تێبینی :- تەنها لە پاش نوێژی بەیانیان و مەغریب ئەم سورەتانە سێ جار دەخوێنین.



## بەشی فەرموودە بۆ لەبەر کردن

١- «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».
(رواه البخاري والترمذي وأبو داود).

باشترینتان ئەوکەسەیە کە قورئان فێردەبێ وکەسانی تریش فێردەکات.

٢- « اتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنْتَ وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُها وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ ». (رواه أحمد والنسائي والحاكم والبيهقي )

لەهەرکات و حالەتدا بووی لەخوا بترسە وپارێزگاربە، بەشوێن هەڵەو تاواندا چاکەبکە.

٣- « وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ وَمالِهِ والنَّاسِ أَجْمَعِين »
(رواه البخاري ).

سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی نییە تاکو من لەخۆی و کەسوکاری وهەموو خەڵکی خۆشەویستتر نەبم لای.

٤- ((الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ)).
( رواه مسلم وأبو داود).

موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لەزمانی و دەستی پارێزراو بن.

٥- « دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ». ( رواه مسلم وأبو داود ).

دوعای مرۆڤی موسڵمان بۆ برای موسڵمان، لەپاشملە، لای خودای قبوڵە.

٦- « لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلا اللَّعَّانِ وَلا الْفَاحِشِ وَلا الْبَذِيءِ ». ( رواه البخاري والترمذي).

بڕوادار تانە وتەشەر لێدەر ولەعنەت ونەفرینکەر وجوێندەر ودەم پیس نییە.

٧- « مَنْ كانَ يُؤمن بالله واليوم الآخر فَلْيُكْرِمْ ضَيفَهُ, ومَنْ كانَ يُؤمن بالله واليومِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ, ومَنْ كانَ يُؤمن باللهِ واليومِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خيْراً أو لِيَصْمُتْ». (متفق عليه).

هەرکەس بڕوای بەخوا وپاشەڕۆژ هەیە با ڕێزی میوانی بگرێت.. هەرکەس بڕوای بەخوا وپاشەڕۆژ هەیە با سیلەی ڕەحم بەجێ بێنێت وئاموشۆی خزم ونزیکانی بکات.. هەرکەس بڕوای بەخوا وپاشەڕۆژ هەیە با قسەی چاک بکات یا بێ دەنگ بێت.

٨- « لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ » . (متفق عليه).
ئەوكەسەی کە گوێ بۆ قسەی خەڵکی هەڵدەخا وقسەچنی دەکات ناچێتە بەهەشتەوە.

٩-« لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا ». (رواه أبو داود بسند صحيح ).

لەئێمە نییە کەسێک بۆ بچووکمان سۆز نەنوێنێ وڕێزی گەورەمان نەگرێ.

١٠- « لا تَقَاطَعُوا وَلاتَبَاغَضُوا وَلا تَدَابَرُوا وَلا تَحَاسَدُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً ». (متفق عليه).

یەکتر مەبوغزێنن و (ڕقتان لەیەکتری نەبێت) پەیوەندیتان پێکەوە مەپچڕێنن. بەیەکتری حەسوودی مەبەن. پشت لەیەکتری هەڵمەکەن و(ئاگاتان لەیەکتری بێت)، هەمووتان بەندەی خوا وبرای یەکتری بن.

١١- « آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ ». (متفق عليه).

نیشانەی ((دوو ڕوو)) سێ شتە: کاتێ قسەی کرد درۆ بکات، کاتی بەڵێنی دا نەیباتە سەر، کاتێ سپاردەی لا دانرا خیانەتی تێدا بکات.

١٢- « لا يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْدًا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». ( رواه مسلم ).

هەرکەسێک عەیب وناتەواوی کەسێک لەدنیادا دابپۆشێت، خوا لەپاشەڕۆژدا عەیب وناتەواوی ئەوکەسە دادەپۆشێت.

١٣- سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): أَيُّ الإِسْلامِ خَيْرٌ ؟ قَالَ « تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ ». (متفق عليه).

پیاوێک لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)ی پرسی: چ جۆرە کردەوەیەکی موسڵمانانە چاکترە؟ فەرمووی: خۆراک ببەخشیت و،سڵاو بکەیت لەوەی دەیناسیت ولەوەش کە نایناسیت.

١٤- «مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ». ( رواه أبو داود ).

هەرکەس خەریکی کاروباری برایەکی بێت، خوا کاروباری بۆ جێ بەجێ دەکات، هەرکەس نارەحەتیەک لەسە موسڵمانیک لابەرێت، خوا بەو هۆیەوە نارەحەتییەکی ڕۆژی دوایی بۆ لادەبات .

١٥- أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟ قُلنا بَلى يارَسولَ الله, قالَ: الإِشْرَاكُ بالله, وَعُقُوقُ الْوَالدَيْن. وكان مُتَّكأً فَجَلَسَ فَقالَ: ألاَ و قَوْلُ شَهَادَةُ الزُّورِ ...(متفق عليه).

ئايا لەگەورەترینی گوناهە گەورەکان ئاگادارتان نەکەمەوە؟ ووتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا، سەرپێچیکردنی دایک وباوک. لەو کاتەدا شانی دادابوو پاشان دانیشت وفەرمووی: ئاگاداربن گەواهی دان وشایەتی درۆش.

١٦- عَنْ إبنِ عُمَرَ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِمَنْكِبِى فَقَالَ « كُنْ فِى الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ ». (رواه البخاري).

پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) بە عەبدوڵای کوڕی ئیمامی عومەری فەرموو : لەدنیادا وەکو غەریبێک یا ڕێبوارێک بژی.



# ٢٥ پێغەمبەرەکان بناسە

١/باوکە ئادەم پێغەمبەر علیە سلام
٢/ئیدریس پێغەمبەر علیە سلام
٣/نوح پێغەمبەر علیە سلام
٤/هود پێغەمبەر علیە سلام
٥/صالح پێغەمبەر علیە سلام
٦/ئیبراهیم پێغەمبەر علیە سلام
٧/لوط پێغەمبەر علیە سلام
٨/ئیسماعیل پێغەمبەر علیە سلام
٩/ئیسحاق پێغەمبەر علیە سلام
١٠/یەعقوب پێغەمبەر علیە سلام
١١/یوسف پێغەمبەر علیە سلام
١٢/شوعەیب پێغەمبەر علیە سلام
١٣/ئەیوب پێغەمبەر علیە سلام
١٤/ذوالکفل پێغەمبەر علیە سلام
١٥/موسی پێغەمبەر علیە سلام
١٦/هارون پێغەمبەرر علیە سلام
١٧/داود پێغەمبەر علیە سلام
١٨/سولەیمان پێغەمبەر علیە سلام
١٩/ئەلیاس پێغەمبەر علیە سلام
٢٠/ئەلیەسع پێغەمبەر علیە سلام
٢١/یونس پێغەمبەر علیە سلام
٢٢/زەکەریا پێغەمبەر علیە سلام
٢٣/یەحیا پێغەمبەر علیە سلام
٢٤/عیسی پێغەمبەر علیە سلام

٢٥/محمد سەردار و رابەری پێغەمبەران (صلی الله علیه وسلّم).

# ژياننامەی پێغەمبەرمان محمد

# (صلى الله عليه وسلم)

١-ناوی (محمد)ە (صلى الله عليه وسلم) ناوی باوكی (عبدالله) ە ناوی باپیری (عبدالمطلب)ە عەرەبە لە هۆزی قورەیشە.
٢- ناوی دایكی(ئامینە) یە كچی وە هەبە.
٣- لە سكی دایكی بوو باوكی وەفاتی كردووە.
٤- لە رۆژی دوشەممە لە (١٢)ی ربیع الاول لە سالّی(٥٧١)ی زاینی لە سالّی(فیل)لە شاری مەكە لە دایك بووە.
٥- ئەو ئافرەتانەی شیریان داوەتە پێغەمبەر- صلى الله عليه وسلم _چوارن ١_(ئامینە) ی دایكی ٢_(ئوم ئەیمەن) ٣-(ثويبة) ٤-(حليمة السعدية) بەلاّم لە هەموو یان زیاتر (حلیمە السعدیة)بووە.
٦- تەمەنی(٦)سالّ بوو دایكی وەفاتی كرد چووە لای باپیری (عبدالمطليب ).
٧- تەمەنی(٨)سالّ بوو باپیری وەفاتی كرد چووە لای مامی (ابوطالب ).
٨- لەتەمەنی(١٢)سالّی لەگەلّ مامی (ابوطالب)چوو بۆ شام بەلاّم لەرێگەدا گەڕایەوە چونكە (بەحیرا)ی راهیب ئاموژگاری مامی كرد كەنەیبات بۆ ئەم سەفەرە ووتی ئەگەر جوولە كە بیبینن دەیناسنەوە و دەیكوژن. ووتی ئەم كورە پلەو پایەكی بەرزی دەبێ.
٩- لەتەمەنی(٢٥)سالّی ژنی هێناوە ناوی خیزانی(خدیجە)بووە (رضی الله عنها).
١٠- سێ كوری هەبوو:١-قاسم ٢-عبدالله ٣-ابراهیم.
١١- چوار كچی هەبوو:١-زینب ٢- روقیة ٣- ام كلثوم ٤-فاطمە.

١٢- دوازده مامی هەبوو: ١-ئیمامی حەمزة ٢-ئیمامی عباس ٣-ابوطالب. ٤-أبولهب ٥-حارث ٦-زوبیر ٧-عبدالكعبة ٨-موقوم ٩-قوثەم ١٠-حیجل ١١-ضرار ١٢-غەیداق بەڵام تەنها (ئیمامی حەمزة )و (ئیمامی عباس) موسڵمان بوون.

١٣- شەش پلكی هەبوو خوشكی باوك: ١-صەفیة -عاتیكه ٣-ئەروا ٤-ئومیة ٥-بەرە ٦-بەیضاء بەڵام تەنها صەفیة موسڵمان بوو.

١٤- بە(صادق الامین) ڕاستگۆی دەست پاك بەناوبانگ بوو.

١٥- لەتەمەنی(٤٠)ساڵی لەشاری مەككە لە ئە شكەوتی (حیراء) لە(١٧)ی ڕەمەزان لە ڕۆژی دووشەممە وەحی بۆهات بوو پیغەمبەر -صلی الله علیه وسلم-.

١٦- ( ٣ ) سال بانگەوازی بەنهینی بوو لەپاشان بەفەرمانی خوا بانگه وازی ئاشكرا كرد.

١٧- ساڵی(١٠)ی پیغەمبەراتی ناونرا ساڵی ماتەمینی(عام الحزن)بە هۆی مردنی (ابوطالب وخدیجة) هەرلەو ساڵەش جوو بۆ طائف بۆ بلاوكردنەوەی ئاینی ئیسلام.

١٨- (١) سال و(٣)مانگ پێش كۆچ كردنی بۆ شاری مەدینە (٢٧)ی ڕەجەب لە بەشیكی شەو لەمە ككە وەچووە (المسجد الاقصی) لە وێ بەرز بۆوە بۆ ئاسمانەكان كە پێی دە گوترێ (الاسراء و المعراج) هەر لەو شەوە لەئاسماندا نوێژ فەرزكرا.

١٩- (١٣) سال لە شاری مەككە مایەوە لە پاشان كۆچی كرد بۆ شاری مەدینە

٢٠- (١) محرم سەری ساڵی كۆچی یە.

٢١- لە ساڵی(٢)كۆچی لە(١٧)ی ڕەمەزان غەزای بەدر ڕوویدا.

٢٢- لە ساڵی (٣) كۆچی غەزای ئوحود ڕوویدا.

٢٣- له ساڵی(٥)کۆچی غەزای الاحزاب ڕوییدا.
٢٤- له ساڵی(٦)کۆچی ریککەوتننامەی لەگەڵ قورەیشییەکان کرد بەناوی ریککەوتننامەی حودەیبیە (صلح الحديبية).
٢٥- له ساڵی(٨)کۆچی فەتحی مەککەی کرد.
٢٦- پێغەمبەر-صلى الله عليه وسلم-بە خۆی له(٢٧) غەزادا بەشداری کردوو و(٤٧) شەریشی ناردووە بۆ غه زا بەخۆی بەشداری نەکردووە.
٢٧- یەکێک لەکارە گرنگەکانی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - رزگارکردنی مرۆڤایەتی بوو لەبێ بڕوایی و کۆیلایەتی و تاریکیەکان بەرەو بڕواهێنان بەتاک وتەنییای خواو بەندایەتی بۆ کردنی و ڕووناکی ئیسلام.
٢٨- هەندێ لەرەوشتەبەرزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) - ١- ڕاستگۆی. ٢-دەستپاکی. ٣-دڵپاکی. ٤-ڕووخۆشی. ٥-دەم پاکی. ٦- ئازایەتی ٧-تێکۆشەری
٢٩- ماوەی پێغەمبەرایەتی(٢٣)ساڵ بوو.
٣٠- له ساڵی(١١)ی کۆچی له (١٢) ربيع الاول کە رۆژی دووشـــەممە لەتەمەنی(٦٣) ســـاڵیدا له شاری مەدینە وەفاتی کردو هەر له شـــاری مەدینە نێژرا.....هەزاران ســـەڵات و سەلام له سەرگیانی پاکی پێغەمبەر - صلى عليه وسلم-



# خوێندنی چەند زیکرێک بۆ منداڵانی خۆشەویست

١/ بسم الله الذی لا یضر مع أسمه شيء في الأرض ولا في السماء وهو السميع العَليم:
هەرکەسێ بەیانیان سێ جارو ئێواران سێ جار بیخوێنێ هیچ زیانێکی پێناگات. [رواه أبی داود وصححه الألبانی]

٢/سبحان الله وبحمده سبحان الله العظیم:
هەرکەسێک بەیانیان سەد جار وە ئێواران سەد جار بیڵێ لە ڕۆژێکدا کەس لە ڕۆژی دوایی دا بە کردەوەی لەم باشتر نایێت مەگەر کەسێک وەک ئەمی وتبێت یان زیکری زیاتری وتبێت [رواه مسلم]

٣/أعوذ بکلمات الله التامات من شر ماخلق:
هەر کەسێ ئێوارە سێجار بیخوێنێ ئەوا لەم شەوەدا پیوەدان زیانی پێناگەیەنێ [رواه الترمذی بسند صحیح].

٤/خواردن و خواردنەوە: پێش خواردن بڵێ:
(بسم الله) واتا بەناوی خودا، ئـــەگەر لەیادت چوو لەو کاتەی کەبیرت دێتەوە بڵێ:
(بسم الله في أوله وآخره)(رواه الترمذي بسندصحيح).
ئەگەر لە نان خواردن لێ بویتەوە بڵێ (الحمـدلله الذي أطعمني هذا ورزقنيه من غير حول ولا قوة)
(رواه أبی داود سنده حسن).

٥/چونه سەر ئاو: لەپێش چونه سەرئاو بڵێ:
(بسم الله اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث)، (رواه البخاري ومسلم)
وه كه هاتيته دەرەوه بڵێ: (غفرانك) .(رواه أبوداود)

٦/چونه ناو مزگەوت: كاتێك دەچین بۆ ناو مزگەوت ئەم دوعايه دەخوێنین (بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله اللهم افتح لي أبواب من رحمتك). وه كاتێك كه له مزگەوت دەچینه دەرەوه ئەم دوعايه دەخوێنین (بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله اللهم إني أسئلك من فضلك اللهم اعصمني من الشَيطان الرَجِيم).

٧/ئەگەر تۆ پژمییت چی دەڵێیت؟
دەڵێم ألحمدلله ئەی بەرامبەرەكەت چی دەڵێت: دەڵێت (يرحمك الله).
ئەی تۆچی پێدەڵێیتەوه؟
دەڵێم: يهديَكم الله ويَصلح بالكم

---

سبحان ربّك ربّ العزّة عمّا يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله ربّ العالمين



ئایا دوعای چونە ژوورەوەی مزگەوت
وەدەرچوون لێی دەزانی؟
أعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم، وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم، بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله، اللهم افتح لي أبواب رحمتك
ئا ئا باشە بۆتی ئەڵێم
بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله، اللهم إني أسألك من فضلك
ئایا دوعا دەکەیت لەکاتی دەرچوونت
لە ماڵ و گەڕانەوەت بۆ ماڵ؟
ئایا تۆ ئامادەیت بۆ چوونە دەرەوە ئەی "عبدالله"؟
بەڵێ "أحمد" من ئامادەم
بەڵێ.. بسم الله، توكلت على الله، ولا حول ولا قوة إلا بالله
اللهم إني أعوذ بك أن أضل أو أُضل، أو أزل أو أُزل، أو أظلم أو أُظلم، أو أجهل أو يُجهل عليّ
دەڵێی: بسم الله ولجنا وبسم الله خرجنا، وعلى ربنا توكلنا

بەدیاری دەبەخشریت و نافرۆشریت

# دایە و بابە

## چۆن فێری دینەکەم دەکەن؟

ئامادەکردنی : سلیم احمد کریم

سەرەتایەکە بۆ فێربوونی ئاینی ئیسلام

چاپی یەکەم
٢٠١٢
هەولێر